# چوار بنچینەكان

## كە جیاوازی دەكەن لەنێوان دینی موسلمانان و دینی عەلمانیان


دانانی شێخی پایەبەرز

علي بن خضير الخضير الله تعالى ئازادی بكات



وەرگێڕانی : سنبلة

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين .

وبعد:

ئەمە پەیامێکی کورتە چەند بنچینەیەکە تێیدا موسڵمان جیاوازی نێوان دینە گەورەکەی خـۆی و نێـوان بـت پەرەسـتیە نـوێیەکە و شـیرکی سـەردەم دەزانێـت کە ناسـراوە بەعەلمانییەت بەهەموو جۆرە زۆرەکانیەوە ، بۆ ئەوەی خۆیان لێ بەدووربگرێت و لێیان دووربکەوێتەوە و حاشایان لێ بکات وە لەخەلکەکەشی کەناسراون بەعەلمانییەکان وە حاشـایان لێ بکات لای الله و تەکفیریـان بکـات و دژایەتیـان بکـات و ڕقـی لێیـان بێـت و جیهاد و کوشتار بکات لەدژیان ، جا ئەگەر بیرمەندەکان بن یانیش ڕۆشنبیرەکان یانیش سیاسەتمەدارەکان یانیش دەسڵاتدارەکان یانیش ڕۆژنامەنوسەکان یانیش گۆرانیبێژەکان یانیش ئەکتەرەکان یانیش بیردۆزەکان یانیش حکومەتەکان یانیش ڕێکخراو وە بێجگە لەمانەش .

وە ئەو چوار بنچینەیەش ئەمانەن :

# بنچینەی یەکەم

ئەو موشـریکانەی کە پێغەمـبەر ( صـلی الله علیـه وسـلم ) یـان بـۆ نێردراوبـوو دانیـان بەڕبوبیەتی ( پەروەردگارێتی ) الله تعالی دا نابوو .

الله تعالی فەرموویەتی: ( قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ والأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللّهُ فَقُلْ أَفَلاَ تَتَّقُونَ )[1] .

واتە: ( ئەی موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) بڵێ ئایا کێ ڕسق و ڕۆزی تان دەدات لە ئاسمان ( بە باران ) و لە زەوی یەوە ( بە ڕووەك ) یا کێ خاوەنی ( دروستکەری ) گوێ و چاوانە وە کێ زیندوو لە مردوو دەردەهێنێ وە مردوو لە زیندوو دەردەهێنێ هەروەها کێ کارەکان هەڵدەسوڕێنێ بێگومان یەکسەر دەڵێن خوا کەواتە ( ئەی موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم )) پێیان بڵێ دەی بۆ خۆتان ناپارێزن لە سزای خوا ؟ ).

وە هەر الله تعالی فەرموویەتی: ( قُل لِّمَنِ الْأَرْضُ وَمَن فِيهَا إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ (84) سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ (85) قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ (86) سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ (87) قُلْ مَن بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ (88) سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّى تُسْحَرُونَ (89))[2] .

واتە: ( ئەی ( موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) ) بڵێ زەوی و ئەوەی لە ناویدایە هی کێ یە ؟ ئەگەر ئێوە شت دەزانن * بێگومان دەڵێن ( هەمووی ) هی خوایە بڵێ دەی ئایا بییر ناکەنەوە * بڵێ ئەی کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمان و پەروەردگاری عەرشی گەورەیە * بێگومان دەڵێن ( هەمووی ) هی خوایە بڵێ دەی ئایا خۆتان ناپارێزن واتە لەخوا ناترسن * بڵێ کێ فەرمانڕەوایی هەموو شتێکی بەدەستە وە پەنای ( هەموو لایەك ) دەدات و کەس لەو پەنا نادرێت ئەگەر ئێوە شت دەزانن * بێگومان دەڵێن ( هەموو

---

1 سورة یونس: 31 .

2 سورة المؤمنون: 84_85_86_87_88_89 .

ئەوانە ) هی خوان بڵێ کەواتە ئێوە چۆن سیحر و جادووتان لێ کراوە ( کە ئاینی خوا بەناحەق دەزانن لەگەڵ داننانتان بەهەموو ڕاستییەکانی ) دا .

وە الله تعالی فەرموویەتی: ( وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلاَّ وَهُم مُّشْرِكُونَ )[3] .
واتە: ( جا زۆربەیـان باوەڕ ناهێنن بە خوا مەگەر ئەوان لەو کاتەدا هاوبەش بڕیاردەرن بۆ خوا ).

وە لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) شەڕ و کوشتاری لەگەڵ کردن و کافری کردن و نەیانیهێناونەتە ناو ئیسلامەوە .
وە بەهەمان شێوە عەلمانییەکان ئەوانەی کە زێدەڕەونین دان بەڕبوبیەتی الله دا دەنێن وە هەنـدێ عیبادەتیشـیان هەیە بـەلام ئەم ( دان پیادانانـەیان بەڕبوبیـەتی الله تعـالی و ئەنجامدانی هەندێك لەعیبادەتەکان ) نەیانیهێناونەتە ناو ئیسلام ، بەڵام ئەوانەیان کە زێدەڕەون تووندترن چونکە لای ئەوان نە پەرستراو بوونی هەیە وە نەپەروەردگاریش و ژیان بە مادده دەزانن .

3 سورة يوسف: 106 .

## بنچینەی دووەم

پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ کەسانێك هاتووە کە چەندین تەشریعات و قانونیان هەبووە کە نێوانیانی پێ یەکلادەکردەوە و چارەسەر دەکرد لەکاتی هەبوونی کێشە و ململانێ و شتی تریش ، وە چەندین داب و نەریتی جاهلیان هەبووە لەسەری ڕۆیشتوون و کاروباریان پێ جێبەجێکردووە وە نەحوکمی الله یان قبوڵ کردووە وە نەڕێبازەکەیشی ، بۆیە الله و پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) کافریانی کردوون و کوشتاریانی کردوون ، وە نەیانیهێناونەتە ناو ئیسلامەوە .

وە لە تەشریعاتەکانیان ئەوەیە کە لەوتەی الله تعالى دا هاتووە: ( وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ )[4] .

واتە: ( لەو ( سەربڕاوە ) مەخۆن کە ناوی خوای لەسەر نەهێنرایەوە ( کاتی سەربڕین ) بێگومان ( خواردنی ) ئەوە تاوان و لەسنوور دەرچوونە وە بێگومان شەیتانەکان بەنهێنی شت بەدۆستانیان دەڵێن بۆ ئەوەی موجادەلە و دەمە دەمێتان لەگەڵ بکەن جا ئەگەر بەگوێیان بکەن ئەوە بێگومان لەهاوبەش بڕیاردەران دەبن ) .

وە الله تعالى دەربارەی قورەیش و شوێنکەوتووانی فەرموویەتی: ( أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ ۚ )[5] .

واتە: ( ئاخۆ ئەو ( بێ باوەڕ ) انە هاوبەشانێکیان هەیە ئاینێکیان بۆ داناوون کە خوا ڕێگەی پێ نەداوە ) .

وە عەلمانییەکان تەشریعات و یاسا و دادگای دەستکردی ناوخۆیی یانیش هەرێمی یانیش جیهانی خۆیانیان هەیە کە نێوانیانی پێ یەکلادەکەنەوە و چارەسەر دەکەن لەکاتی هەبوونی کێشە و ململانێ و شتی تریش ، وە چەندین داب و نەریتی جاهلیان هەیە لەسەری دەڕۆن ناویان لێیان ناوە شارستانییەت و ڕووناکبیری و پێشکەوتن ، وە

---

4 سورة الأنعام: 121 .

5 سورة الشورى: 21 .

نەحـوکمی اللە یـان قبـوڵ کـردووە وە نەڕێبازەکەیشـی بـۆیە دەبێـت تەکفیـر بکـرێن و بەرائەت و حاشایان لێ بکرێت .

## بنچینەی سێیەم

پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ کەسانێك هاتوە دین بۆ هەندێ شت بەکاردێنن و لەهەندێ شت بەکاری ناهێنن ( واتە بۆ هەندێ شت یان لەهەندێ کات و شوێن الله دەپەرستن و پەنای بۆ دەبەن بەڵام بۆ هەندێ کات و شوێن و شت ناپەرستن و پەنای بۆ نابەن ) الله لەکاتی تەنگانە دەپەرستن بەڵام لەکاتی خۆشی دا ناپەرستن و هاوەڵ و هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەن .

الله تعالى فەرموویەتی: ( فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ )[6] .

واتە: ( ئینجا کاتێ ئەو ( بێ باوەڕانە ) سوار کەشتی دەبن ( و ترسان لە نوقم بوون ) تەنها هاوار لەخوا دەکەن بەدڵسۆزی و گەردن کەچی یەوە کەچی کاتێ خوا ڕزگاریان دەکات و دەگەنە وشکانی کوت و پڕ ئەوان هاوبەش بۆ خوا دادەنێن ) .

وە بەهەمان شێوە هەندێ شت بۆ الله ئەنجام دەدەن و بۆ بتەکانیشان هەندێ شت وەکو ئەوەی لەوتەی الله تعالى دا هاتووە: ( فَقَالُواْ هَذَا لِلّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَذَا لِشُرَكَآئِنَا )[7] .

واتە: ( بە گومانی خۆیان وتیان ئەمە بۆ خوایە وە ئەوەش بۆ هاوبەشەکانمان (بتەکانمان)) .

وە عەلمانییەکان الله دەپەرستن تەنها لەمزگەوتەکان وە لەڕەمەزان وە لەهاوسەرگیری وە لەطلاق و باری کەسێتی ، وە بۆ بێجگە لەمانە دەگەڕێنەوە بۆ لای تەشریعاتەکانیان و داب و نەریتە گۆمڕاییەکانیان .

---

6 سورة العنكبوت: 65 .

7 سورة الأنعام: 136 .

## بنچینەی چوارەم

پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) بۆ موشریکەکان هات کە چەندەها پەرستراو و خوایان هەبوو زۆربوون و جیاوازبوون هەندێك لەناو ئەو موشریکانەدا هەبوون کەپەیکەر و بتەکانیان دەپەرست وە هەشیان بوو فریشتەیان دەپەرست وە هەشیان بوو جنۆکەیان دەپەرست وە هەشیان بوو ئەستێرەکانی دەپەرست وە هەشیان بوو ئاگریان دەپەرست وە هەشیان بوو عیسای کوڕی مەریەمیان دەپەرست وە هەشیان بوو پێغەمبەرانی دەپەرست وە هەشیان بوو پیاوچاکانی دەپەرست کەچی لەگەڵ ئەمەشدا پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) جیاوازی نەکرد لەنێوانیاندا لەحوکم و لەکوفر و شەڕ و کوشتاریان .

وە عەلمانییەکان بەهەمان شێوە چەندەها پەرستراویان هەیە و ئەو پەرستراوانە زۆرن بەپێی پەرستراوەکەیان دەبنە چەندین گرۆپ و تاقم هەیانە ئەمریکا دەپەرستێت وە هەشیانە ئەوڕۆپییەکان دەپەرستێت وە هەشیانە ڕوسەکان دەپەرستێت وە هەشیانە سیستەمی نوێی جیهانی دەپەرستێت وە هەشیانە دەستەڵاتدارەکان دەپەرستێت وە هەشیانە بیردۆزەکان دەپەرستێت وە هەشیانە نیشتیمان دەپەرستێت وە هەشیانە قەومیەت و جنس ( ڕەگەز ) دەپەرستێت وە هەشیانە سەکردەکانیان و بیرمەندەکانیان دەپەرستن و هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوانیاندا لەکوفر و هەڵگەڕانەوە لەدین .

## بابەتێك

وە تـاقمێکی تـری گـۆمڕا کـە دەچێـتە ژێرباریـان لەم سـەردەمە ، ئەوانـیش پـردی عەلمانییەکـانن و کلکەکانیـانن و بێچووەکانیـانن ، ئەوانـیش تـاقم ( گـرۆ ) ی سەردەمییەکانن .

غولاتی مورجیئەن لەبابەتی ئیمان و تەکفیر .

وە لەبابەتی فیقهـ لەئەهلی هەوا و ئارەزو و بەدڕەوشتی و ملکەچ بوون بۆ واقع و ئەوەی ڕێگەپێدراوە و بەزەندیق کۆتاییان دێت .

## لەکۆتاییی دا

وتەی شیخ عبدالرحمن بن محمد الدوسري بۆ زیاد دەکەین چونکە ئەو ــ ئەوەندەی کە دەیزانم ــ لەکەسە یەکەمینەکان بوو کە هەستا بەدەرخستن و خستنەڕووی ئەم بت پەرستیە نوێیە و ئەم شیرکە نەفرەت لێکراوە سەردەمییە کە ئەویش عەلمانییەتە ، کە لە کۆتاییی کتابی کشف الشبهات ( چاپی یەکەم ساڵی 1385هـ) کەکۆتاییەکەی خستۆتەسەر کتابـی ( کشـف الشـبهات ) ی شـێخ محمـدی کـوڕی عبـدالوهاب ، کە تێیـدا ( شـیخ عبدالرحمن بن محمد الدوسري ) پەردەی لابردووە لەسەر بت پەرستیە نوێیەکە و شیرکی سـەردەم هەروەکـو چـۆن شـێخ محمـدی کـوڕی عبـدالوهاب شـیرکی سـەردەمی خـۆی دەرخستووە .

شیخ عبدالرحمن الدوسري دەڵێت: ( شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب لەکتابی کشف الشـبهات چارەسـەری شـیرکی خوڵەفـاوێتی کـردووە لەشـێوەی پاڕانەوە لەمردووەکـان و نادیارەکـان و پیرۆزکردنـی گۆڕەکـان ، پاشـان چەنـدین جـۆر و شـێوە لەشـیرك دەرکەوتـن بەچەندین ناو و نازناو کەجاهلەکانی پێ هەڵخەڵەتاوە و چەندین کەسی فریودراو و ڕق و کین لەدل هۆگری بوون ) .

پاشـان دەڵێـت: ( ئەوەی کە پشـتگیری و سـەرکردایەتی ئەو تـاوانەی کـرد ( دەرکەوتنـی شـیرك ) جـولەکە و مەجوسـییەکان بـوون ، کاتێـك لەزینـدووبوونەوەی ئیسـلامی ڕاسـت

ترساون کە شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب بۆی گەڕایــەوە و پێی هەڵساوە و دەعوەی بـۆ کـردووە لەگەڵ یارمەتیـدەر و هاوکـارانی ، وە لەو کاتەشـدا سـەرخەرانێکی زۆریـان بەدەسـت هێنـا لەعشـیرەتەکەمان و گرِیـان بەردایە حەماسـیە نەفامەکـان بەئاراسـتەی دەمارگیرییە نەتەوەییەکـان لەهەمـوو ئوممەتـی ئیسـلام ، بـت پەرسـتی نـوێ و پەرسـتنی ماددە و ئارەزووات و پیرۆزکردنی کەسەکان دەرکەوت بەبیانووی ڕەگەزنامـە و نیشتیمان ( واتە یـەك ڕەگەزنـامە و یـەك نیشـتیمانیان هـەیە )، تـاوەکو هەلگەڕانەوەیەکـی نـوێی پەیـداکرد و دروسـت کـرد لەجیهـانی ئیسـلامی بەگشـتی و جیهـانی عەرەبـی بەتایبەتــی بەوەی بانگەشــەیان دەکــرد لەبنەمــا نیشــتمانییەکان و بۆچــوونە مــاددییە ڕازاوە و جوانکراوەکان بەنازناوانێك کە ڕووکەشـەکەیان خۆشی و ڕەحـمەتە و نـاوەڕۆکە نادیار و شاراوەکەی سزا و ناخۆشیە ) .

وە پاش ئەم پێشـەکیە شێخ عبدالرحمن الدوسري باسی واتـای پەرستراوێتی ( الألوهیة ) کردووە کەدوو بنچینەی هەیە:

1_ کوفرکردن بەهەموو پەرستراوێك ( جگە لە الله ) .

2_ تاك ڕاگرتنی الله لەپەرەستن و تەسلیم بوون و ملکەچبوون بۆ حوکمەکەی .

پاشان باس لەحەقیقەتی پەرستن و خوشویستن لەپێناوی الله و ڕق لێبوونەوە لەکافران دەکات .

پاشـان باسـی حەقیقەتـی دینـی پێغەمبەر ئیبـراهیم ( سـەلامی الله ی لێبێـت ) دەکـات و دەڵێـت: ( وە بەهـۆیەوە ڕادەی نقـووم بـوونی زۆربەی کەسـە لەسـەر ئیسـلام حیسـاب کراوەکـان ( ئەوانـەی لەسـەر ئیسـلام هـەژمارکراون ) دەبینیـت بـۆ نـاو ئەم بت پەرسـتیە نـوێیە و ئەوەی هێناویـانە لەبنەمـا ڕۆژئاواییەکـان و مەزهەبە مادییەکانیـان کە سـنوری نیشـتمانیان لەسـەرووی سـنوری الله دانـاوە و خۆیانیـان سەرپشـك کـردووە لەوەی دایدەڕێژن و ڕێکی دەخەن پێچەوانەی ئەوەی کە الله و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمانی پێ کردوون ، وە شوێنی ئەوە کەوتن کەپیاوەکان مەیلیان بۆی چووە و کردوویـانەتە خـوای خۆیـان بەخوشەویسـتی و گەورەکـردن وە کردوویـانەتە شـەریك و

هاوبەش بێجگە لە الله وەکو نەتەوایەتی و نیشتیمانییەتی و ئەوەی سەپێنراوە لەمەزهەبە مادییەکان ) .

پاشان باسی ئەوانەی کردووە کە نیشتمانیان کردۆتە هاوبەشی الله ، یەکێك لەوانەیان دەڵێت:

بلادك قدمها على كل ملة -- من أجلها أفطر ومن أجلها صم

واتە:

وڵاتەکەت پێی لەسەر هەموو میللەت و دینێکە -- وە لەپێناویدا ڕۆژوو دەشکێنم وە لەپێناویدا ڕۆژوو دەگرم

وە دۆستایەتی دوژمنەکانی الله یان کرد بەبیانوی ڕەگەز و نیشتمان ، وە شەریعەتیان (شەریعەتی ئیسلام) پەکخست بەبیانوی پێشکەوتنێکی بۆگەن ، وە پەرستنی هەموو طاغوتێك لەپێناو ئەمەدا .

وە لە بنەما پوچەڵەکانیان:

* وەکو بنەمای " دین بۆ الله و نیشتمان بۆ هەمووان " .
* وە بنەمای " ئاین پەیوەندی نێوان بەندە و پەروەردگارەکەیەتی بەتەنها و پەیوەندی بەژیانەوە نییە " .
* وە بنەمای " ئیرادەی گەل لەئیرادەی الله یە " .

وە باسی ئەوە دەکات کەهێشتا دەرچووانی قوتابخانە داگیرکارییەکان بایەخ بەم چەمکانە دەدەن لەنێو چینەکانی ئوممەتی ئیسلامی ، وە دەڵێت قوتابخانەکان یەکەم شوێنن کە لەڕێگەیەوە داگیرکەران بیروبۆچون و ڕۆشنبیرییەتی خۆیانیان تێیدا سەپاندووەتە سەرمان .

پاشان دەڵێت: ( پێویستە لەسەر موسڵمانان بە پیر و گەنجەکانەوە و بەحکومەت و گەلانەوە ڕێگە بگرن لەم شیرکە نوێیە و بت پەرستیە نوێیە و دژی بوەستنەوە ) .

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه اجمعين